# دەربارەی دۆنکیشۆت



وەرگێڕانی
حەمەکریم عارف

# دۆن كیشۆت

میگل دو سرڤانتس ساڤدرا ١٥٤٧ - ١٦١٦ ڕۆماننووس و شاعیرێكی ئیسپانییە. لە شەردا یەخسیر بوو و لە جەزایردا وەكوو كۆیلە فرۆشرا و بە دانی سەربەها ئازادیی خۆی كڕییەوە. چەندین شانۆنامەی نووسیوە، كە چەند دانەیەكی كەمیان ماون.

***

ئەم شاكارە، شیننامەی مرۆڤێكی زەلیل و زەبوون و لاواز و بێتوانایە، كە لەجیاتی هێزی بازوو، سەودا و كەڵكەڵەی شاسواریی لە سەردایە و بە هەموو بێجورمی و لەڕولاوازییەكی خۆیەوە، جلوبەرگی پۆڵایینی سەلاحشوران و جەنگاوەران لەبەر دەكات،

بە سواری پیرە بارگیرێکی قۆتڕ دەبێت و بە مەبەستی داکۆکی و بەرگری لە شەرافەت و ئابڕووی مرۆڤانی، دەچێتە شەڕی دوژمنانی خەیاڵی و سەرەنجام، کۆمیدینامەیەک دێتە ئاراوە، کە هەرچەندە بە شێوە و بە ڕواڵەت پێکەنیناوی و پێکەنینئامێزە، بەڵام لە جەوهەر و ناوەڕۆکدا خەڵکی هەستیار و واقیعبین دێنێتە گریان، چیرۆکێکی کۆمیدی-تراژیدییە، کە بە شێوە و ڕواڵەت پێکەنینئەنگێزە و بە جەوهەر و نێوەڕۆک، گریانئەنگێزە و لە هەندێ شوێندا ئەوەندە خەمناکە، کە دڵتان دێنێتە ژانو ئەم بەرهەمە نەمرە، کە بە گوتەی ڕەخنەوانانی ئەدەب یەکێکە لە شاکارە هەرە بەرز و هەڵبژاردەکانی شاکارێن ئەدەبیاتی جیهان، دۆن کیشۆتی ناوە.

دۆن کیشۆت، کە لە نیوەی دووەمی سەدەی شازدەیەمەوە تا ئەمڕۆ، بە نموونەی مرۆڤی بێئاوەز و فیشاڵباز و گەوجرەفتار دانراوە، لە ڕاستیدا مرۆڤێکی گەوج و کەللەپووت نییە،

چونکە ئەگەر نەزان و کەللەپووت بووایە، هەرگیز ئەم ئامانجە گەورە مرۆڤدۆستانانەی نەدەبوو، کە لە ڕای بەرگری لە چاکی و چاکەکاری، دژی خەراپە و خەراپەکاری ڕانەدەوەستا، بەڵکوو مرۆڤێکی بەئاوەزە، گەرەکیەتی خۆی لە ڕێگەی پشتیوانی لە هەژاران و مەزلوماندا فیدا بکات، بەڵام چونکە مەرجەکانی سەلاحشوران و جەنگاوەران و شاسوارانی تێدا نییە، بۆیە وەکوو شێتێکی پەتەڕی دێتە بەرچاوان و دەبێتە مایەی گاڵتە و پێکەنینی خەڵک و خوا.

لۆرد بایرونی شاعیری ئینگلیزی، دەربارەی ئەم قارەمانە سەیرە، دەڵێت، «دۆن کیشۆت پیاوێکی دروستکار و لایەنگری هەق و عەدالەتە، سەربوورد و بەسەرهاتەکانی، بە پێچەوانەی ڕواڵەتیەوە، نەک پێکەنینئەنگێز نین، بەڵکوو مایەی داخ و کەسەرن».

تورگینیف، چیرۆکنووسی ڕوسی، دەربارەی دەڵێت، «بەلای دۆن کیشۆتی مرۆڤدۆستەوە،

شەرم و نەنگە، کە مرۆڤ هەر بۆ خۆی بژی و تەنیا لە خەمی خۆیدا بێت، دۆن کیشۆت قارەمانێکە لە دەرێی خۆیدا و بۆ خەلکی دی دەژی، بۆیە مرۆڤێکی یەجگار بەرکەتی و شایانی ڕێزو حورمەتە".

بە هەرحال، دۆن کیشۆت گوراو و خەلقەندەیەکی نەمری خاکی ئیسپانیایە، کە لە سەرەتاکانی سەدەی هەڤدە و تا ئەمرۆکە لەنێو خەلکی شارەزا و ئەدەبناس و ئەدەبزاندا دەژی و هەرجارەی بە شێوەیەکی تازە لەسەر تەختەی شانۆ یا پەردە و شاشەی سینەما، یا ئۆپرا یان لەبەینی بەرپەڕین کتێباندا دەر دەکەوێ و شەیدایان و ئاشقانی هونەر، یان دێنێتە پێکەنین، یان دەخاتە گریان. ئەم نەجیمزادە سالووکەی سەدەکانی ناڤین، کە زیاد لە چوار سەد سال لەمەوپێش هاتووەتە دنیاوە و لەم ماوە دوورودرێژەدا هەمیشە دۆست و یار و یاوەری خەلکی باش و مرۆڤدۆست بووە و ئەگەر ڕوالەتی عەیاران و

شاسواران و پاڵەوانانیشی نەبووبێ و چووبێتە هەر شەڕێکەوە، هەر بەشی شکست و دۆڕان بووبێ، ئەوا دڵێکی سەرڕێژ لە میهر و وەفا و ڕووحێکی بارگاوی بە خۆشیی هەبووە - خۆشەویستی هەمووان بووە و تا دنیا دنیایە، هەر بە خۆشویستراوی دەمێنێتەوە.

جا ئێستا با بزانین، خالق و داهێنەری ئەم مرۆڤە سەیر و جوانە کێیە و ئەم داهێنەرە بەرکەتییە لە چ هەلومەرجێکدا ئەم بەسەرهات و سەربووردە قوڵ و پڕ خەون و خەیاڵەی هێناوەتە ئاراوە؟ گەر تەمەشایەکی ژیانی ئەو بکەین و هەڵوەستەیەک لە ئاستی ئەو ڕووداو و بوویەرانە بکەین کە لە ماوەی تەمەنی شەستونۆ ساڵەیدا بەسەری هاتوون، ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێ، کە پیاوێک بووە زۆر لە دۆن کیشۆت سەیرتر و ئەفسانەئامێزتر و بەسەرهاتێکی سخ و چڕتری هەبووە.

میگل دوسرڤانتس ساڤدرا ١٥٤٧ - ١٦١٦، کە تا پەنجا ساڵی جگە لە دەربەدەری و

شمشێربازی و سەرەڕۆیی و سەرکێشی و ڕیسکبازی، هیچ هونەرێکی دیکەی نەبووە و ئەمڕۆ لە ڕیزی نێودارترین چیرۆکنووسانی جیهاندایە، لە ۱٥٤٧/۱۰/۹دا لە شاری ئالکا ئیسپانیا هاتووەتە دنیاو شەست و نۆ ساڵ دوای ئەوە، لە ۱٦۱٦/٤/۲۳دا، لە مەدریدی پایتەختی ئەو وڵاتە ماڵاواییی لە ژیان کرد. بابی لە ئەشراف و نەجیبانی کاستیل بوو و ئاواتی ئەوە بوو، کوڕەکەی ببێ بە شاسوار و جەنگاوەرێکی ناسراو و نێوداری ئیسپانیا، بەڵام میگل هەرچەندە شارەزاییی تەواوی لە دوو هونەری شاسواری و جەنگاوەریدا پەیدا کردبوو، لە هەرشتێک زیاتر خولیای دوو کار بوو: شیعردانان و تۆلازی و چاولەوەڕێنی.

ئەم ئارەزووانە کێشە و گرفتی زۆریان بۆ دروست کرد، و ناچار لە تەمەنی هەڤدە ساڵیدا، تەرکی یار و دیاریی کرد و بۆ ئیتالیا ڕەڤی و هەڵات، چونکە سەری لە سەرکێشی و ڕیسکان دەخورا، پەیوەندیی بە سوپای ئیتالیاوە کرد

و دژی هێزی عوسمانلی لە شەڕی *لیپانتو*دا بەشداریی کرد. لەم شەڕەدا بازووی چەپی بە خەستی بریندار بوو و بەیەکجارەکی سەقەت بوو. زیدەباری ئەمەش، دانەسەکنا، دوای چوار ساڵ خزمەت لە سوپای ئیتالیادا، پەیوەندیی بە فەوجی جەنگاوەرانی ئیسپانیاوە کرد و لەلایەن پاشاوە میداڵی ئازایەتیی پێ بەخشرا، بەڵام زۆری نەبرد، کە لە کاتی سەفەرێکی دەریاییدا، لەلایەن ڕێگرانی دەریاییەوە بەدیلی گیرا و لە جەزایردا بە کۆیلەیی فرۆشتیان، پێنج دانە ساڵی تەواو بە یەخسیری و کۆیلایەتی لەجەم عەرەبان مایەوە و تا لە ئەنجامدا کەسوکارەکەی بە شوێنەکەیان زانی و میراتییەکەی بابیان فرۆشت و لە کۆیلەفرۆشانی عەرەبیان کڕییەوە و ئازادیان کرد.

لە ئیسپانیادا، بەو نیازەی بە هەرشێوەیەک بووە، ژیان و بژێویی خۆی دابین بکات، دەستی دایە نووسینی چیرۆکێک بە نێوی *گالاتیو*، بەڵام هیچ کەسێک نەیکڕی، چەند

شانۆنامەیەکی نووسی، لێ نە سوودی ماددیی لێ وەر گرتن و نە شۆرەت و ئیحتوباری پێ پەیدا کردن. ناچار بۆ شاری سیوبل ڕۆیی و لەوێندەر کارێکی چکۆلەی بەدەست هێنا و بوو بە فەرمانبەری دەولەت. بە هۆی نابەلەدی لە کاری فەرمی و دەولەتی، یان بە هەر هۆیەکی دیکەوە بوو، کە تا ئیستا بۆ لێکۆلەران خویا نییە، بڕەپارەیەکی زۆری بە ملدا هات و کەوتە زیندان. ئەم بوویەرە ناخۆشە بووە مایەی ئەوەی سەرچاوەی بەهرە پەنهانییەکەی بتەقێتەوە و دەر بکەوێ.

سیرڤانتس لە زینداندا دەستی بە نووسینی کتێبێک کرد، کە لەناو بزرترین کەسی ئیسپانیاوە کردی بە نێودارترین مرۆڤی سەرانسەری هەموو گیتی. ڕۆمانی دۆن کیشۆتی نووسی، کە بەرگی یەکەمی لە سالی ١٦٠٥دا بلاو بووەوە و سەیر ئەوە بوو، کە لە ماوەیەکی یەجگار کورتدا، بە شێوەیەکی ئەوتۆ لەلایەن خەلکی ئیسپانیا و پورتوگالەوە پێشوازی کرا.

کە لەپڕ لە هەموو شوێنێکدا ناوی کەوتە سەر زاران.

ڕەخنەگران هۆی ئەم سەرکەوتنە لەز و خێرایە دەگێڕنەوە بۆ ئەمەی کە سیرڤانتس لە چیرۆکی دۆن کیشۆتدا، زۆر بەتوندی دەسەلاتدارانی وەخت و دابونەریتی گەوجانەی سەردەمی خۆی بەر شەلاقی ڕەخنە داوە و لە قالبی قارەمانێکی گێلۆکەدا کار و کردەوەی ئەوانی بەر تانەوتەشەران داوە. بە هەرحاڵ، بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە کلاوڕۆژنەیەکی ئومێد و شادی لە تاریکیی هەژاری و ناوبزریدا بە ڕووی ئەودا کردەوە و پاش پتر لە دە ساڵ، ئەوسا بەرگی دووەمی هەمان کتێب بە دەستی خوێنەران گەیی، هەرچەندە ئەم کتێبە زۆر بەلەز پاچڤەی زمانانی دیکە کرا و هەرچەندە مایەی ستاییشی هەموان بوو، بەڵام خاوەنەکەی لە هەژاری و دەسکورتیدا دەژیا.

با ئێستا بزانین سیرڤانتس، ئەو پیاوەی هەڤدە ساڵ بەر لە شەکسپیر هاتە دنیا

و ڕێک لەو ساڵەدا کۆچی دوایی کرد، کە شەکسپیریان بە خاک سپارد، بە ئەفراندنی دۆن کیشۆت چ خزمەتێکی بە دنیای ئەدەبیاتی ئیسپانیا کردووە.

نەجیمزادەیەکی هەژاری گۆشەگیری دوورەپەرێز، بە ناوی ئالونزوکیشانو، لە گوندێکی ستانی مانسی ئیسپانیادا هەبوو. ئەم گوندییە لە ژوورە پەرپووتە وێرانەکەی خۆیدا، هیچ کارێکی نەبوو، جگە لە خوێندنەوەی کتێبان و لە کتێبدا تەنیا حەزی لە ئەفسانانی قارەمانان و شاسوارانی جەنگاوەر بوو. ئالۆنز و بەدرێژایی هەیڤان و ساڵان، بە جۆری چووە قوڵاییی ئەو ڕۆمانە خەیاڵئەنگێزانەوە، کە بەرەبەرە بە خەیاڵ خۆی لێ بوو بە سەلاحشور و شاسوارێکی بەتوانای لەشکستنەهاتوو. ڕۆژێ کۆنە زرێیە ڕزیوەکەی باپیرەی لەبەر کرد، سواری یابوویەکی مردەڵەی نیوەگیان بوو، نێوی خۆی نا دۆن کیشۆت و بەنیازی هاوکاری و پشتیوانیی هەژاران و شەڕ دژی

ستەمکاران، دەستی بە سەفەر کرد.

بە گوێرەی دابونەریتی ڕۆژ، بابایەکی شاسواری جەنگاوەر و دلێر، دەبێ ماشوقەیەکی هەبێت، دۆن کیشۆت کیژە گوندییەکی قەڵەوی، کە کاری ئەوە بوو گۆشتی بەرازی دەکرد بە قاورمە، وەکوو ماشوقە و دلداری خۆی هەڵبژارد و ناوی ناسکی دول چینیا-دل توبوزوری لێ نا، لە لایەکی ترەوە، چونکە نەیدەتوانی بەتەنیا ئەم سەفەرە ترسناکە بکات و دەبووا هاوڕێیەکی دەگەڵ بێت، کابرایەکی دێهاتیی بەهێز و باهۆی بە نێوی سانچوپانزا بۆ یارمەتیی خۆی هەڵبژارد. ئەم پیاوە لەنێو ئاشنایانی خۆیدا بە گەوجیەتی و بێشاوەزی بەنێوبانگ بوو. ئیدی دەستووری دایە، کە سواری گوێدرێژەکەی خۆی بێت و دوای ئەو بکەوێت. بەم جۆرە خەمخۆرانی مافی مەزلومان و خەباتکارانی دژ بە ستەمکاران دەستیان بە سەفەرە پڕ بوویەر و بەسەرهاتەکەی خۆیان کرد.

لە یەکەم قۆناغی ئەم سەفەرە پڕبوویەرەدا، دلاوەرانی خەیاڵی، تووشیان بوو بە تووشی دوژمنێکی دێوئاسای یەکجار بەهێزەوە، ئەویش ئەوە بوو، دۆن کیشۆت پاش ئەوەی ماوەیەک ڕۆیی، گەیشتە ئاشێکی با، کە پەڕە گەورەکانی پانکەکانی ئاشەکە زۆر بەخێرایی بەدەم تەوژمی بایەکەوە دەخولایەوە. دلاوەر و شاسواری دالگۆشتی مردەڵە، کە بەسەر بارگیرە قۆتڕەکەیەوە بوو و نێزەیەکی بە دەستەوە بوو، دەنگی یاریدەدەرەکەی خۆی دا، کە لەسەر کەرەکەی دانیشتبوو و بەیداخی تایبەتیی ئەوی هەڵگرتبوو، بەڵێ، دەنگی دا کە ئاگای لەو بێت و ئەوسا بێ ئەوەی بزانێت چی دەکات، بەرەو پەڕەی پانکەکانی ئاشەکە هێرشی برد. ئاشی بێ هەست، هیچ ڕەحمی بە گێلی و نەزانیی ئەو نەکرد، پەڕە پۆڵایینەکان، دۆن کیشۆت و بارگیرە قۆتڕەکەیان هەڵدایە حەوا و لە نیوەی ئاسمانەوە کەوتنە سەر زەوی. ناڵە لە دڵی دلاوەر و شاسواری پیرەوە

هەستا و لە هۆش خۆی چوو.

پدروپرزی کەشیشی دلۆڤانی گوندەکە، کە دڵی بە حاڵی سووتابوو، دەگەڵ نیکولاسی ڕدێنتاشی گونددا، کە پیاوێکی دڵاوا و باش بوو، قارەمانی گێل و بێئەقڵیان لە جێگەدا خەواند و کەوتنە پەرستاریی. کەشیشەکە دەیویست بە دڵسۆزی و قسەی خۆش و زمانی شیرین و لۆژیکی، ئەم دلاوەر و شاسوارە شێت و شورە تێبگەیەنێ، کە ئەم کارانە کاری ئەو نییە، بەڵام دۆن کیشۆت پەیتاپەیتا دەیگوت، کە جادووگەران هەر بۆ ئەزیەتدانی ئەو، دوژمنە نارەسەن و نەگریسەکەی ئەویان گۆڕیوە و کردوویانە بە ئاشی با و ڕۆژی ئەویان بەو ڕۆژە ڕەشە گەیاندووە. سەرەنجام، دۆن کیشۆت چاک بووەوە، جارێکی دی دەگەڵ یاریدەدەرەکەی خۆیدا، سانچۆی دلاوەر و شاسواردا بەرەو شوێنێکی نادیار کەوتە ڕێ، بەو حاڵەوە، لەبن لێوانەوە ئەم شیعرانەی دەربارەی هیجرانی یار و ماشوقەکەی دەگوتەوە:

"دولچینیای جوانی من...

«بۆچی تەمەشایەکی ئەڤین و ئەشقی دۆن کیشۆتی دلدارت ناکەی؟ ئەی دارودرەختان... ئەی گیا و سەوزەزاران... ئەی گوڵانی قەشەنگ، کە بەسەر ئەم چیا سەرکەشانەوە جیلوەی جوانی دەفرۆشن، ئەگەر ڕاستە بە سیارۆژی من شاد نین و نابن، گوێ لە سکاڵاکانی من بگرن. ئێوە هەمووتان شایەد بن، کە دۆن کیشۆت، سەلاحشوری بێنەزیر و نەبەز، لێرەدا، لەم شوێنەدا، لە هیجرانی دولچینیای دلداری خۆیدا گریا و فرمێسکی ئاگرینی ڕشت.»

دۆن کیشۆت بەدەم ڕێگەوە ئەو جۆرە شیعرە دلدارییانەی ڕێک دەخست و لەبەر خۆوە دەیوتنەوە و دەڕۆیی، تا دیسانەوە دوژمنانی خەیاڵی تازەی لێ پەیدا بوون. ئەو ستەمکارانەی ئەم جارە کە دەبووایە بە دەستی دۆن کیشۆت سزا بدرێن، دوو ڕەبەنی لات بوون، کە شانبەشانی گالیسکەیەک ڕێیان دەکرد و خانمێک لەنێو گالیسکەکەدا دانیشتبوو.

دۆن کیشۆت یەکسەر بە سانچۆی ڕاگەیاند، کە ئەم جارە دوژمنانی خوێنڕێژ، شازادە خانمێکیان بە دیلی گرتووە و دەیبەن و ئەو کە سەلاحشور و شاسوار و جەنگاوەرێکی دلێرە، دەبێ ئەو شازادە خانمە ڕزگار بکات، ئەنجامی ئەم شەڕە دیار بوو، سانچۆ لە ترسی کوتەکخواردن بە لایەکدا هەڵات و دۆن کیشۆتیش بەدەمناڵەناڵەوە، بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی.

سانچۆپانزا هەرچەندە مرۆڤێکی هێمن و بێوەی بوو، ئەم جارەیان لە سۆنگەی هەڵەی ئاغایەوە تووشی نسیبەتێکی گەورە بوو. دۆن کیشۆت دەگەڵ ئەودا چوو بۆ کاروانسەرا و میوانخانەیەک و لەوێندەر فەرتەنە و ئاژاوەیەکی شێتانەی نایەوە و زەرەر و زیانێکی فرە بە خاوەن میوانخانەکە گەیی. خاوەن میوانخانەکە داوای قەرەبووی کرد و چونکە سەلاحشوری دلاوەر ڕۆیی، ئەوان یاریدەدەرەکەی ئەویان، واتە سانچۆیان، بە

بارمتە گرت و لە پەتۆیەکیانەوە پێچا و لە سووچێکدا حەپسیان کرد. واریقاتی ئازادیی ئەو و پاشان شەڕی ئەو جووتە دەگەڵ ڕانە پەزێکدا، خۆی لە خۆیدا حیکایەتێکی خۆش و بەلەزەتە. دۆن کیشۆت مێگەلەکە بە دوژمن دەزانێ و بە نێزەوە بەرەو مێگەلەکە هێرش دەبات و پەلامار دەدات، کۆتایی و ئەنجامی ئەم شەڕەش، کوتەکخواردنی خۆی و یاریدەدەرە دلاوەرەکەی بوو...

لە چیرۆکی دۆن کیشۆتدا، دیمەنی کۆمیدیتر لەوانەی باس کران، هەن. لە سووچی لەوەڕگەیەکدا، کە دۆن کیشۆت شەوێ ئیسراحەت دەکات، سانچۆ کۆمەڵێک شوان دەبینێ و لە برسانا داوای شیریان لێ دەکات. شوانەکان هەندێ ماستی بۆ لە کڵاوخودەکەی دۆن کیشۆت دەکەن و دەڕۆن. دۆن کیشۆت لە دەنگێک خەبەری دەبێتەوە و یەکسەر کڵاوخودەکەی لەسەر دەنێت، تا سواری بارگیرە قۆترەکەی ببێ، بەڵام لەپڕ ماست بە

سەر و پۆتەڵاکیا دێتە خوارێ. قارەمانی گێل و نەزان، یەکسەر وا دەزانێ مێشکی تواوەتەوە و دەڕژێ، لەگەڵ ئەمەشدا، خۆی شێلوو نەکرد و خۆی تێک نەدا. لەم کاتەدا چەند ڕێبوارێک، شێرێکیان لە قەفەسێک نابوو و خستبوویانە سەر گالیسکەیەک و بە جادەیەکی خاکی گوندێکدا دەهاتن، دۆن کیشۆت کە گەییە ئاستیان، فەرمانی دا دەرکی قەفەسەکە لە شێرەکە بکەنەوە و ئەو گیانلەبەرە دڕندەیە بۆ لای ئەو بنێرن. شێرەوانەکان لە ترسی گیانی خۆیان، بە گوێیان کرد، بەڵام بە ڕێکەوت شێرەکە، کە دیار بوو شەکەت و خەواڵو بوو، باوێشکێکی دا و لە قەفەسەکە نەهاتە دەرێ. دۆن کیشۆت ڕووی تێ کردن و گوتی، «دەبینن، کە شێری دڕندەش لە من دەترسێت!»

لە کۆتاییی چیرۆکەکەدا، دۆن کیشۆت لە شاری بەرشەلۆنەدا دەبینینەوە. خۆی و سانچۆی یاریدەدەری بەو سەر و سیما عەنتیکە و پێکەنیناویەوە بەنێو خەڵکیدا دەگەڕێن.

بە جووتە و بە واقورماوی و ئەبلەمرییەوە دەروانتە، کۆشک و تەلاران، لەنگەرگە و بەندەران، پاپۆڕانی لەنگەرگرتوو و هەموو دیمەنێکی شار، دۆن کیشۆت لە بەرشەلۆنەدا شەڕێک دەکات و لەو شەڕەدا سەرکەوتوو دەبێت و باوەڕی تەواو بە خۆی دەکات، کە سەلاحشوور و شاسوارێکی بێوێنە و بێڕەقیب و هەڤرکە.

بەسەرهات و واریقاتی سووتاندنی کتێبەکانی لەلایەن کەشیشی گوندەکەوە، بە بۆنەی ڕزگاربوون و مەتبارییی زۆری ئەوەوە، خۆی لە خۆیدا فەسڵێکی جوان و سەرنجڕاکێشی کتێبی دۆن کیشۆت پێک دێنێ، ئەو کاتەی دۆن کیشۆت بۆ گوندەکەی خۆی دەگەڕێتەوە و پیر و شەکەت و پەککەوتوو لە جێگەی مەرگدا دەکەوێ، بێگومان ڕوندکی خەم لە چاوی خوێنەر دێنێ، چونکە خوێنەر هەرچەندە زۆر بە نەزانی و گێلی و بێفاوەزیی ئەو پێکەنیوە بەلام لە ناخی خۆیدا هەمیشە خۆشی ویستووە

و هاوسۆزیی دەگەڵدا کردووە، چونکە ئەم سەلاحشورە لاتە، ڕەمز و نیشانەی خۆشی و خۆشەویستی و دلۆڤانی و مرۆڤایەتیی و مرۆڤدۆستی بووە.

***

ڕەخنەگران و شارەزایان پێیان وایە، کە سێرڤانتسی داهێنەری دۆن کیشۆت هەرچەندە زۆر بەتوندی دابەزیوەتە سەر کاری گەوجانەی سەلاحشوران و شاسوارن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێزی بۆ ئایدیا و ئارمانجێن سەلاحشوران داناوە و نەیبوغزاندووە. سێرڤانتس بە نووسینی ئەم کتێبە، گەلێک لە دابونەریت و خوو و خدە و باوەڕێن خەلکی لە ڕۆژگار و سەردەمی نەزانیتدا تومار کردووە و پاراستووە و هەرکەسێک ئەم کتێبە لە سەرەتاوە تا کوتایی وەخوێنێ، دەتوانی زۆر بە ئاسانی و ڕوونی خەلکی سەدەی شازدەیەمی ئیسپانیا بە هەموو ئەتوار و کردار و بیر و بیرکردنەوەیەکیەوە لە بەر چاوی

خۆی بەرجەستە بکات.

لە ڕووی شێوەی نووسینەوە، کتێبی دۆن کیشۆت پەخشانێکی ڕەوان و عال نییە و لە زمانی سیرڤانتسدا هەڵەوپەڵەی زۆر دەبینری، بەڵام وێڕای ئەمەش، نووسەر مەبەستەکانی خۆی ئەوەندە جوان و لەبەردڵان دارشتووە و کارە گەوجانەکانی قارەمانەکانی بە ڕادەیەکی ئەوەندە جوان و وێنە گرتووە، کە خوێنەر هەرگیز بیر لەو هەڵانە ناکاتەوە.

میللەتی ئیسپانیا و هەموو ئەو کۆمەڵگەیانەی لە سەرانسەری دنیادا شارەزاییان لە زمانی ئیسپانیدا هەیە و ئەو زمانە دەزانن، هەمیشە شانازییان بە خۆوە کردووە، کە پتر لە چوار سەد ساڵێک لەمەوپێش، نووسەر و هزرڤان و هونەرمەندێکی میناکی سیرڤانتس، کەسایەتییەکی ئەوەندە بەدیمەن و سەرنجڕاکێشی ئەفراندووە، کە هەندێ لە وەشانکارەکان گوتوویانە، دۆن کیشۆت لە دوای کتێبی ئینجیلی موبارەک، لە سەرانسەری

ڕۆژاوادا پڕفرۆشترین کتێب بووە و زۆرترین چاپ کراوەتەوە. ئەوەی بەڵگەنەویستە، ئەمەیە کە سێرڤانتس بە نووسینی ئەم بەرهەمە، خۆی گەیاندووەتە ڕیزی هەڵکەوتووە بلیمەت و نەمرەکانی جیهان و شانازییەکی گەورەی بە زمان و میللەتی ئیسپانی بەخشیوە.

سەرچاوە:

تصویری از ادبیات کلاسیک جهان - ۱۲ - معرفی دن کیشوت - اپر میگل دو سروانتس ساودرا - شرکت سهامی کتابهای جیبی - وابسته به موسسه انتشارات امیر کبیر - اسفند ۱۳۸۸.